## ناساندنی خاوەنی بیروباوەڕ :

ناو : يعقوب بن إسحاق بن إبراهيم بن يزيد النيسابوري لە ئەصلدا الإسفراييني .

كونیەكەی : أبو عوانة .

لەدایكبووی : دوای ٢٣٠ هـ .

وەفاتی : ٣١٦ هـ رحمه الله .

## ستایش لەسەری :

أبو عبدالله الحاكم ئەڵێ : أبو عوانة لە زانایانی فەرموودە و جێگیرەكانیانە .

الذهبي ئەڵێ : أبو عوانة پێشەوای حافظی گەورە، خاوەنی (المسند الصحيح) كە لەسەر (صحيح مسلم) دەری هێناوە و وە هەنێک فەرموودەی کەمی بۆ زیاد کردووە لە دەروازەکانی کۆتایی، وە گوێی گرتووە لە حەڕەمەین - مەککە و مەدینە - و شام و میصر و یەمەن و ثەغور و عێراق و جەزیرە و خوڕاسان و فارس و ئەصبەهان، وە زۆرترین دەرچوونی هەبووە، وە سەرکەوت لەو پلەیەدا، وە پێشی هاوتەمەنەکانی کەوت.

وە هەنێک لە ئەهلی عیلم ئەڵێن: یەکەم کەس بووە کە مەزهەبی الشافعي و کتێبەکانی بردووەتە إسفرايين، وەری گرتووە لە الربيع المرادي و المزني - دوو تايبەتترين تەلەبەی الشافعي رحمه الله -.

## سەرچاوەی بیروباوەڕ:

أبو عوانة لە (المسند المستخرج على صحيح مسلم) دەستی کردووە بە باسکردنی دەروازەکانی سوننەت و بیروباوەڕ وە بەڵگەی بۆ هێناوەتەوە بە فەرموودە صەحیحەکان.

## وتەکانی أبي عوانة لە دەروازەکانی سوننەت و بیروباوەڕ :

١ - ئیمان وتە و کردەوەیە، وە لەو کردەوانە کردەوە گەلێک هەن کاتێک ئەنجامی دا بە وتە و کردەوە ئەچێتە بەهەشت، وە دانپێنان سوودی پێ ناگەیەنێت تاوەکو دڵی دڵنیا نەکات لەوەی بۆ الله ئەکرێت .

٢ - وە ئیمان بەوەی بەهەشت کەس ناچێتە ناوی جگە ئیمانداران، وە جیاوازی نیە لەنێوان ئیمان و ئیسلام .

---

: هەندێک لە ئەهلی عیلم بۆ ئەوە ڕۆشتوون کە جیاوازی نەکەن لە نێوان ئیمان و ئیسلامدا، بەڵام زۆربەی سەلەف لەسەر ئەوەن کە ئیمان و ئیسلام جیاوازن وەک چۆن بەڵگەی ڕاشکاوی لە قورئان و فەرموودە لەسەرە .

٣ - بە صەحیحی هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمانی کردووە بە بلال رضي الله عنه کە بانگ بکات (ناچێتە بەهەشتەوە ئیللا نەفسی موسڵمان نەبێت) .

وە فەرمانی کرد بە عمر رضي الله عنه کە بانگ بکات (ناچنە بەهەشتەوە ئیللا ئیمانداران نەبێت) .

وە الله تبارك وتعالى ئەفەرموويێت : ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ [آل عمران : ٨٥] .

وە الله باسی صیفەتی ئیمانداارانی کردووە لە سورەتی الأنفال، وە لە سورەتی المؤمنون، ئەفەرموويێت : ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (١) إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ (٢) ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ (٣) ﴾ [الأنفال]

وە ئەفەرموويێت : ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ (١) ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ (٢) وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ (٣) وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ (٤) وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ (٥) إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ (٦) فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ (٧) وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ (٨) وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ (٩) أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ (١٠) ﴾ [المؤمنون] .

٤ - وە هەرکەس واز لە نوێژ بهێنێت کافر بووە، وە نوێژ بەرزترین کردارەکانە بە شێوەیەک ئەو کەسەی وازی لێ بهێنێت بە وازلێهێنانەکەی کافر ئەبێت .

٥ - وە تاوانەکان لەسەر چەند جۆرێکن :

أ - لەوانە ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی دەرئەکات لە ئیمان کاتێک بیانکات، وەک فەرمایشتی ﷺ : (زیناکار ئەوکاتەی زینا ئەکات ئیماندار نیە، وە دز ئەوکاتەی دزی ئەکات ئیماندار نیە) .

ب - وە لەوانە پێی ئەبێت بە مونافیق، وە ئەگەر نوێژ بکات و ڕۆژوو بگرێت و دان بنێت بە ئیسلامدا، وەک فەرمایشتی ﷺ : (نیشانەی مونافیق سیانە: کاتێک قسەی کرد درۆ بکات، وە کاتێک بەڵێنی دا نەیباتە سەر، وە کاتێک ئەمانەتی پێدرا خیانەت بکات) .

ج - وە لەوانەش کاتێک پیاو بیڵێت و بیکات ئەبێتە کوفر و فیسق و ئاگری بۆ واجب ئەبێت، وەک فەرمایشتی ﷺ : (هەر پیاوێک براکەی کافر بکات، وایە ئەگەر وەک ئەوەی ئەو وتبێتی، وە ئەگەرنا کوفرەکە تووشی ئەبێت) .

وە فەرمایشتی ﷺ : (جوێندان بە موسڵمان فیسقە، وە جەنگ کردن لەگەڵیدا کوفرە) .

د - وە لەوانەش کە بەندە بیڵێت یان بیکات ناچێتە بەهەشتەوە بەو تاوانەی، وەک فەرمایشتی ﷺ : (هەرکەس خۆی بداتە پاڵ غەیری باوکی وە بشزانێت ئەوە باوکی نیە ئەوا بەهەشت لەسەری حەرامە) .

وە فەرمایشتی (هیچ ئەمیرێک نیە کە فەرمانی موسڵمانان بگرێتە ئەستۆ دواتر جیهادیان بۆ نەکات و ئامۆژگاریان نەکات ئیللا ناچێتە بەهەشتەوە لەگەڵیان)

هـ - وە لەوانەش کە سزا و تورەیی الله واجب دەکەن بۆ خاوەنەکەی، وە هیچ کردارێک لەگەڵیدا سوودی پێ ناگەیەنێت کاتێک بگاتەوە بە الله پێی.

---

: ئەو فەرموودانەی کە هێناویەتی لە باس کردنی تاوانە گەورەکان ئینسان دەرناکەن لە ئیسلام، وە ئەوە ئەو فەرموودانەی سزایە کە هەنێک لە پێشەوایانی سوننە وای ئەبینن بەڕێ بکرێت لەسەر رووکەشەکەی بەبێ تەفسیر، وە فەرموودەکانی کۆتایی پێهێناوە بە باسکردنی بیروباوەڕی دەربارەی ئەو کەسانەی خاوەنی تاوانە گەورەکانن و ئەمرن لەسەری بەبێ تەوبە، بەوەی لەژێر ویستی الله تعالی دان ئەگەر بیەوێت سزایان ئەدات وە ئەگەر بیەوێت لێیان خۆش ئەبێت، کە ئەمەش دەرخەری ئەوەیە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەی هەیە لەو بابەتە .

سەرپێچیکار بە تاوانەکەی ئاگری بۆ واجب ئەبێت مەگەر بگاتەوە بە الله و تەوبەی کردبێت، ئەگەر تەوبەی نەکردبێت ئەوە لە ژێر ویستی الله یە، ئەگەر بیەوێت لێی خۆش ئەبێت وە ئەگەر بیەوێت سزای ئەدات.

٦ - وە هەرکەس لەو کافرانەی کە موحاریبن دان بنێت بە ئیسلام ئەوا خوێنیان پارێزراو ئەبێت ئەگەرچی دان پیانانەکەشیان لەبەر ترس و لادان لە تۆڵەکردنەوە بێت لێی دوای ئەوەی تووشی بووە لەسەر کوفر و جەنگان لە پێناوی، وە ناخی ناپشکنرێت، وە هەر کەس بیکوژێت دوای ئەوەی دانی نا بە ئیسلامدا ئەوە لە ئیمان دەرچووە.

٧ - وە قورئان کەلامی الله تعالى یە غەیر مەخلوقە.

٨ - وە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردووە کە بە قورئانەوە سەفەر بکرێت بۆ خاکی دووژمن، لەبەرئەوەی ئەوەی تیایدایە قورئانە، وە کەلامی الله یە.

٩ - وە ئیمان بەوەی الله تعالى بە بەندەکانی و بۆ بەندەکانی پێئەکەنێت.

١٠ - وە الله تعالى ئادەمی علیه السلام درووست کرد بە دەستی خۆی.

١١ - وە الله تعالى ڕوو ئەکاتە ئاگر وە ئەویش ئەڵێت ئایا زیاتر هەیە، تاوەکو پەروەردگار تبارك وتعالى قاچی تێ ئەخات.

١٢ - وە الله تعالى هەموو شەوێک دائەبەزێت بۆ ئاسمانی دوونیا.

١٣ - وە الله ناخەوێت، وە تەرازوو دائەبەزێنێت و بەرزی ئەکاتەوە، وە کردەوەکانی ڕۆژ بەرز ئەبنەوە بۆلای هەموو ڕۆژێک، وە کردەوەکانی شەو بەرز ئەبنەوە بۆلای هەموو شەوێک.

**١٤** - وە ئیمان بەوەی ئیماندااران ڕووی پەروەردگاریان ئەبینن.

**١٥** - وە ئیمان بەجێگیرکردنی دەنگی قەڵەمەکان لەسەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە.

**١٦** - وە ئیمان بەوەی موسى عليه السلام بەرزکراوەتەوە بەسەر پێغەمبەرەکان بە قسەکردنی لەگەڵ تبارک وتعالى.

**١٧** - وە ئاسمانەکان هەنێکیان لەسەر هەنێکی تریانەوەن، وە دەرگا و پەردەیان هەیە.

**١٨** - وە ئیمان بەوەی بەهەشت درووستکراوە، وە پێغەمبەر ﷺ چووەتە ناوی، وە لەسەرووی ئاسمانەکانەوەیە. وە سدرة المنتهى لەسەرروویەتی، وە الله لەسەرروویەتی، وە پێغەمبەر ﷺ لەوێدا - سدرة المنتهى - گەشت پێی.

---

**: ئەم ئیمامە بەڕێزە شافیعی مەزهەبە، وەک دیارە لە هەموو بابەتەکاندا عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەی هەیە و سیفەتەکانی الله عز وجل جێگیر ئەکات بەو شێوەیەی ئیمامەکانی سەلەف وەکو الأوزاعي و سفيان الثوري و مالک بن أنس و الشافعي و أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهويه و البخاري و تەواوی زانایانی تری سەلەف رحمهم الله جێگیریان کردووە، وە ئەمەش ڕەددێکی کوشندەیە بۆ ئەشعەریە جەهمیە پەکخەرە کەلام پەرستەکان لعنهم الله تعالى لعنة واسعة کە خۆیان ئەدەنە پاڵ مەزهەبی ئیمامی الشافعي رحمه الله درۆ**

**بەدەمیەوەیە ئەکەن، بەڵام سەلەف و ئیمامی الشافعي ش لێیان بەرین و بە کافر و زەندیقەیان ئەزانن.**

**١٩ -** وە یەکەم کەسانێک کە ئەچنە بەهەشتەوە لە ئیمانداران دەموچاویان لەسەر شێوەی مانگە، دواتر لەوانەی ئەچنە ناوی دوای ئەوان دەموچاویان وەک نور وایە، دواتر نوری کەمتر لەوەی پێشووتر.

**٢٠ -** وە ناچێتە بەهەشتەوە ئیللا نەفسێکی موسڵمان نەبێت، وە نیوەی ئەهلی بەهەشت ئوممەتی محمد ە ﷺ، وە کەس نابێت بە ئوممەتی محمد ئیللا موسڵمان نەبێت، وە شەفاعەتەکەی تەنها بۆ ئوممەتەکەیەتی نەوەک بۆ ئوممەتەکانی تر کە شوێنی ئەکەون و چاوی لێ ئەکەن لە نزیکەکان و دوورەکان، وە نزیک بوونەوە لە پێغەمبەر بە تەقوایە.

---

**: واتە نزیکبوونەوە لە رسول الله ﷺ بە تەقوا و خواپەرستی و شوێنەوتنی سوننەتەکەیەتی، نەوەک وەکو هەندێک موشریک و گومڕا ئەڵێن ئێمە لە ئالی بەیت ین و نزیکین لە رسول الله ﷺ وپاشان هەرچی کوفرو شیرک هەیە ئەنجامی ئەدەن.**

**٢١ -** وە ئیمان بەوەی دۆزەخ درووستکراوە، وە دەرگاوانی هەیە.

**٢٢** - وە خەڵكانێک تیایدا ئەمێننەوە بە هەمیشەیی، وە تیایانایە ئەچنە ناوی دواتر دەرئەهێنرێن ئەبرێنە بەردەم بە پەروەردگاریان.

**٢٣** - وە ئاگر نەوەی ئادەم ئەخوات جگە پاشماوەی سوجدەکان لەوانەی شاهێدیان داوە بە لا إله إلا الله.

---

**: وتنی لا إله إلا الله هەر بە دەم نا بەڵکو ئەبێت هەموو ژیانت بۆ ئەو وشەیە بێت تا سەرفرازی قیامەت بیت .**

**٢٤** - وە ئیمان بەوەی سزای ناوگۆڕ حەقە.

**٢٥** - وە دەجال حەقە.

**٢٦** - وە عیسای کوڕی مریم علیه السلام حەقە، وە کاتێک دائەبەزێت حوکم ئەکات بە کتێبی الله، وە سوننەتی محمد، وە یەکێک لە ئوممەتی محمد ئەبێتە پێشەوایان.

---

**: خەڵکانێکی کافر هەن ئەڵێن هەنێک ئایەت و حەدیث بۆ ئەم سەردەمە نابێت و دونیا پێشکەوتووە، کەچی عیسا علیه السلام لە کۆتایی دونیاشدا حوکم بەو قورئان و سوننەتە ئەکات، جا کەسانێکی حیزبی بەناو ئیسلامی وا بڵێن ئەبێت عەلمانیەکان چی بڵێن؟**

**٢٧** - وە قیامەت هەڵناسێت هەتا لەسەر زەوی الله بە تاک و تەنهایی بپەرسترێت، وە ئیسلام کەم ئەبێتەوە لەسەر هەموو زەوی، وە ئەگەڕێتەوە بۆ مەدینە وەک چۆن لەوێوە دەستی پێکرد، وە لە فیتنەکاندا ئیسلام ئەڕوات.

**٢٨** - وە ئیمان بەو سێ نیشانەیەی کە هەرکەس دوای دەرچوونیان ئیمانی پێ بهێنێت لێی قبوڵ ناکرێت، وە ئیمان بەوەی هیچ کەسێک نییە لە کافران ئەو ڕۆژە ئیللا ئیمان ئەهێنن و ئەگەڕێنەوە لە کوفرەکەیان - بەڵام وەک وتی دوای دەرچوونیان و بینینی حەقیقەتەکە ئیمانی پێ بهێنیت هیچ سوودی نابێت - ، وە ئەوانیش: دەجال، وە ئاژەڵەکە، وە هەڵهاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوە.

**٢٩** - وە ئیمان بە هەڵهاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوە، وە لە شوێنی مانەوەی، وە ئەوەی هەموو ڕۆژێک هەڵنایەت تا مۆڵەت وەرنەگرێت.

**٣٠** - وە یەکەمین کەسانێک کە داوای شەفاعەت لە پێغەمبەران و محمد صلوا الله علیهم أجمعین ئەکەن ئەو ئیماندارانەن کە ئەیانەوێت الله لەو دۆخەی تێیدان ڕزگاریان ببێت، وە شەفاعەت بۆ ئەهلی دۆزەخ لەدوای تەواوبوونی قەزاوەتی پەروەردگارە .

**٣١** - وە ئیمان بە شەفاعەت بۆ ئەو کەسەی بڵێت لا إله إلا الله، وە لە دڵیدا شتێک لە ئیمان هەبێت، وە ئاگر دەموچاویان ناسوتێنێت، وە شەفاعەت

سوودی نیە بۆ کەسێک کە بڵێت لا إله إلا الله وە لە دڵیدا هیچ ئیمانێک نەبێت .

**٣٢** - وە صیراط حەقە، وە پردی دۆزەخە، وە یەکەم کەسانێک بەسەریدا تێئەپەڕن محمد و ئوممەتەکەیەتی.

**٣٣** - وە ڕیاکاران بە کارەکانیان لە دونیا پشتیان ئەبێت بە هێڵێکی ڕاست ناتوانن سوجدە ببەن کاتێک ئیمانداران سوجدە ئەبەن لەوکاتەی لاقی دەر ئەخات - لاقی الله تعالى - ، وە نورەکەیان ئەکوژێنرێتەوە .

**٣٤** - وە ئیمان بەو کەوثەرەی دراوەتە محمد ﷺ، وە درووستکراوە و بوونی هەیە، وە ڕووبارێکە لە ئاو، خۆڵەکەی میسکە، وە هەرکەس لە ئوممەتەکەی ئەوەی گۆڕیبێت کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لەسەری بووە ناگات بە حەوزەکەی.

**٣٥** - وە گوێڕایەڵی و شوێنکەوتن بۆ کاربەدەستان لە کاتی ئاسانی و نارەحەتیدا ئەگەر چی بەندەیەکی حەبەشیش بێت، وە واجبە گوێڕایەڵی کردنی، وە ئەگەر بێتو بە ڕێنوێنی پێغەمبەر ﷺ کاری نەکرد، وە لەسەر سوننەتی نەبوو - مەبەستی ئەوەیە ئەگەر لادانیشی هەبوو لە سوننەت بەڵام نەگاتە کوفر و شیرک - وە ئەگەر دای لە پشتی بەردەستەکانیشی .

وە واجبە گوێڕایەڵی کردنی لە هەموو ئەو شتانەی بانگت ئەکات بۆی، وە شوێنکەوتنی مادام فەرمانت پێ ناکات بە سەرپێچی الله تعالی، هەرکات فەرمانی پێکردیت بە سەرپێچی ئەوا گوێڕایەڵی و شوێنکەوتن نیە.

وە ئارامگرتن لەسەریان ئەگەر ستەمیان کرد، وە پارە و موڵکیان بە زوڵم برد، و وازهێنان لە ڕووبەڕووبوونەوەیان .

وە ئەفەرمووێت ﷺ : (باشترینی پێشەواکانتان ئەوانەن کە ئێوە ئەوانتان خۆش ئەوێت، وە ئەوانیش ئێوەیان خۆش ئەوێت، وە خراپترینی پێشەواکانتان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانە و ڕقیان لێتانە، وە بە لەعنەتیان ئەکەن و بە لەعنەتتان ئەکەن) .

وتیان : ئەی ڕسول الله ئایا ڕووبەڕوویان نەوەستینەوە بە شمشێر؟

وتی : (نەخێر، هەتا نوێژتان لەناودا ئەنجام بدەن، ئەگەر لە کاربەدەستەکەتان شتێکتان دی کە ڕقتان لێیەتی ئەوە ڕقتان لە کردەوەکەی بێت، وە دەستان لە گوێڕایڵی کردن مەکشێننەوە) .

إسحاق بن راهویە وتی : سوننەت لەسەر ئەوەیە، وە تیاچوونی مورجیئەکانی تێدایە .

**: وتەی إسحاق (وە تیاچوونی مورجیئەکانی تێدایە) لەبەر ئەوەی رسول الله ﷺ ئەنجامدانی نوێژی کرد بە هۆکاری ڕووبەڕوونەبوونەوەی بە شمشێر، وە نوێژلە کردەوەیە، وە کردەوەش لە ئیمانە، وە موسوڵمانانیش تەنها ئەتوانن لەسەر دەسەڵاتداری کافر دەربچن، کەواتە کە نوێژی کرد موسوڵمانە و نابێت لەسەری دەربچن، وە ڕوونی کردەوە کە موسوڵمانە ئەگەر نوێژ بکات، وە ئەگەر نوێژی نەکرد کەواتە کافرە و ئەتوانن لەسەری دەربچن، کەواتە بە ئەنجامنەدانی کردەوەیەک کە نوێژە کافربوو .**

**٣٦** - وە لە کاتی فیتنەکان پابەند بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواوە، چونکە ئەوە پارێزبەندیە بۆت.

**٣٧** - وە هەرکەس لەسەر ئوممەتی محمد ﷺ دەربچێت جەنگ بکات بۆ کۆمەڵێک، وە لە چاک و خراپیان بدات و لە گوێڕایەڵی دەربچێت، ئەوە لە ئوممەتی محمد ﷺ دەرچووە .

**٣٨** - وە جیهاد بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت، وە بەردەوام کەسانێک هەن لە ئوممەتی محمد ﷺ لەسەر حەقن بەرگری ئەکەن لە دین، وە کوشتار ئەکەن لە پێناویدا، وە سەریان ئەخەن لە دژی پێچەوانەکارەکانیان تا ڕۆژی قیامەت، وە هیچ کەسێک لە ئەهلی دینەکانی تر سەرناکەوێت بەسەریاندا.

**٣٩** - وە ئیمان بەوەی پێغەمبەر ﷺ لە منداڵیەوە تا ئەوکاتەی وەحی بۆ کرا ئیماندار بووە بە الله و هیدایەتدراو بووە و عابد بووە.

**٤٠** - وە ئیمان بەوەی پێغەمبەر ﷺ گەورەی هەموو خەڵکە لە ڕۆژی قیامەت، وە لەناو پێغەمبەراندا زۆرترین شوێنکەوتەی هەیە.

**٤١** - وە ئیسڕا و میعراج حەقە، وە پێغەمبەر ﷺ بە نەفسی بەرزکرایەوە نەک بە ڕۆحی، وە پێغەمبەران دوای مردنیان بەرزئەکرێنەوە بۆ ئاسمان.

**٤٢** - وە پێغەمبەر ﷺ لە شەوی میعراجدا پەروەردگاری نەبینی، پەروەردگار داپۆشراو بوو بە نورێک لەوەی سەیری ڕووی پیرۆزی بکرێت.

**٤٣** - وە ئیمان بەوەی پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردگاری خاوەن عیززەتی نزیک بووەوە، وە پەروەردگاری لێی نزیک بووەوە ئەندازەی دوو کەوان یان کەمتر، وە ئەوەی ڕەنگەکان السدرة ی داپۆشی لە نورەکەی بووە - نوری الله تعالی - .

**٤٤** - وە ئیمان بەوەی پێغەمبەر ﷺ یەکەم کەسە شەفاعەت ئەکات بۆ خەڵکی لە ڕۆژی قیامەت، وە یەکەم کەسە کە دەرگاوانی بەهەشت دەرگای بۆ ئەکاتەوە.

**٤٥** - وە ئیمان بەوەی پێغەمبەر ﷺ شەفاعەت ئەکات بۆ أبي طالب ی مامی، وە سزاکەی لەسەر سووک ئەکرێت بەوە، وە ڕزگاری نابێت لە ئاگر بەوە، وە کافر چاکەکانی هیچ سوودی پێ ناگەیەنێت کاتێک مرد.

**٤٦ -** وە هەرکەس لە ئەهلی کیتاب بگات بە پێغەمبەر محمد ﷺ، یان گوێی لێ بێت - لە بانگەوازەکەی - ، ئیمانی پێ نەهێنێت وە بەوەی پێوەی نێردراوە ئیللا لە ئەهلی دۆزەخە.

**٤٧ -** وە هەرکەس نکۆڵی بکات لەوەی قسە بکات بەو وەسوەسەیەی کە بە نەفسیدا دێت ئەوە لە ئیمانەوەیە.

---

**بەشێک لە خەڵکی بە هەڵە لەم فەرموودەیە حاڵی بوونە :**

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلُوهُ إِنَّا نَجِدُ فِي أَنْفُسِنَا مَا يَتَعَاظَمُ أَحَدُنَا أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ، قَالَ: وَقَدْ وَجَدْتُمُوهُ ؟**

**قَالُوا: نَعَمْ .**

**قَالَ: ذَاكَ صَرِيحُ الْإِيمَانِ.**

**(صحيح مسلم : ١٣٢)**

**ئەبو هورەیرە رضي الله عنه ئەڵێ:**

**هەندێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هاتن پرسیاریان لێی کرد ئێمە شتانێک لە دڵەکانمان بەدی ئەکەین کەسمان جورئەت ناکات باسی بکات و دەری ببڕێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەو شتەتان لەلا دروست بووە؟)**

**ووتیان: بەڵێ .**

**فەرمووی: (ئەمە نیشانەی ئیمانێکی بێ خەوشە).**

ئەو شتەی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری دەربارەی کرد کە ئایا لەلایان دروست بووە، نەفیکردنی وەسوەسەکە بوو نەک دروست بوونی وەسوەسەکە

إسحاق بن راهويه ئەڵێ:

گەر نەفی وەسوەسەکەی کرد ئەوا نەفیکردنەکەی ئیمانێکی بێ خەوشە، وەسوەسە کردنەکە ئیمانێکی بێ خەوش نیە، بەڵکو نەفیکردنەکەی ئیمانێکی بێ خەوشە، بەڵام وەسوەسە کاتێک کەوتە دڵ و نەفی نەکرد ئەوا لەناو چوونە.

(السنة لحرب الكرماني : ٦٨١)

والحمدلله رب العالمين